**بسم الله الرحمن الرحيم**

سەرکردەکانی قاعیدە هەوڵیاندا بێن بەڕوێکی نوێ بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتی گەلان، تا وایان لێهات کە بتپەرستان وگاورەکان بکەن بە بەشێك لە "گەل" و "نشتیمان" کە دەیانپارێزن ودەترسن لەزیانێك کە بەریان کەوێت!

ڕەنگە ئەوەت لا ناخۆش بێت وبڵێیت: "لە اللە بترسە، کابرا! ئایا قاعیدە نیە کە هەڕەشە لەجیهان دەکات، وجوولەکە وگاورە دەستڕێژیکەرەکانی سەر ئیسلام وموسڵمانان دەترسێنێت؟!"

**دەڵێم: وەڵامەکەت دەست دەکەوێت لە زەواهیریەوە، کاتێك گوتی:**

"ئاراستە داواکراوەکان: [...] دەستدرێژی نەکردنە سەر **گاورەکان وسیخ وهیندۆسەکان** لە وڵاتە ئیسلامیەکان، وە ئەگەر ئەوان دەستڕێژیان کرد ئەوە ئێمە تەنها وەڵامیان دەدەینەوە، لەگەڵ ئەوەی ڕایدەگەیەنین کە ئێمە دەستپێشخەری ناکەین بۆ جەنگیان، لەبەر ئەوەی ئێمە سەرقاڵین بە جەنگی سەری کوفری جیهانی، **وە ئێمە پێداگرین وسورین لەسەر ئەوەی بەیەکەوە بژین بەئاشتی وپێشوازیکردن لە یەکتری** ئەگەر دەوڵەتی ئیسلام دامەزرا"! [توجيهات عامة للعمل الجهادي].

وە گوتی: "**لێرەوە دەمەوێت هەڵوێستمان دوبارە بکەمەوە لەگەڵ گاورەکانی ئەقباط**، وە ئێمە هەوڵی جەنگکردن لەگەڵیان نادەین، چونکە ئێمە سەرقاڵین بە جەنگ لەگەڵ دوژمنی گەورەی ئومەت، وە **چونکە** ئەوانە **هاوبەشمانن لە نشتیمان، ئەوانەی کە دەمانەوێت لەگەڵیان بژین بەئاشتی وسەقامگیری**"! [رسالة الأمل والبِشر لأهلنا في مصر - الحلقة 8].

**وە گوتی:**

"ئاراستە داواکراوەکان: [...] **هاندان وپاڵپشتیکردنی هەموو** ئەوانەی **کە یارمەتی** مافە زەوتکراوەکانی موسڵمانان دەدەن وبەرپەرچی دەستڕێژیکەران دەدەنەوە بۆ سەریان جا بەوتە یان بۆچون یان بەکردار، **وە دورکەوتنەوە لەئازاردانیان بەدەست بێت یان بە وتەی نەشیاو، تا ئەو کاتەی کە پاڵپشتبن بۆ موسڵمانان ودەستدرێژیکەر نەبن**، [وە] سەرخستنی ستەملێکراوان ولاوازەکانی موسڵمانان **وغەیری موسڵمان** لەوانەی ستەمیان لێکردون ودەستدرێژیان کردوەتە سەریان، **وەیارمەتی لاواز وستەملێکراوەکان وهاندان وپاڵپشتیکردنی هەموو** ئەوانەی کە یارمەتیان دەدەن هەرچەندە **موسڵمانیش نەبن"**. [توجيهات عامة للعمل الجهادي].

**شیکردنەوەی دەستەواژەکان لەوتەکانی زەواهیری:**

- "هاوبەش لەنشتیمان" بەشێك لە "گەل" لای دەستەواژەی شۆڕشگێڕی، وە ئامانج لێی دڵنیاکردنەوەی "هاوبەشەکانی نشتیمانە" لە گاور وبتپەرستان ئەوە دەبێتە هۆی هاندانی "شۆڕشەکان" و"شۆڕشگێڕان" هەروەك

ئەقباتە خاچپەرستەکان پاڵپشتی "شۆڕشە پیرۆزەکەیان [الله پەنامان بدات! ] کە موحەممەد مورسی بۆ هێنایین"... ئەی وەرگێڕەری دڵەکان دڵەکانمان چەسپاو بکە لەسەر ئاینەکەت.

- وە بیری "دورکەوتنەوە لە ئاراستەکردنی ئازاریان جا بەدەست بێت یان بە وتەی نەشیاو، تا ئەو کاتەی پاڵپشتبن ودژی موسڵمانان نەبن [...] وە پاڵپشتیکردن وهاندانی **هەموو** ئەوانەی یارمەتیان دەدەن هەتا ئەگەر موسڵمانیش نەبن" بێدەنگی (الجبهة الإسلامية) -هاوپەیمانی قاعید- ڕوندەکاتەوە لە تەکفیرکردنی تاغوت ئەردۆگان، ئەو لە توندترین ئەوانەیە "پاڵپشتی شۆڕشی سوریا"ن، بەڵکو دەستەواژەی "دەوڵەتە هاوڕێکە" بۆ تورکیا و پیرۆزبایکردن لە ئەردۆگان، لەسەر "سەرکەوتن"ی لە کورسی تاغوت گۆڕانێکی کردەییە بۆ ئاراستەکانی زەواهیری لەسەر مەزهەبی حسام عبدالرؤوف (بگەڕێوە بۆ: "القيادة الجديدة لتنظيم القاعدة - ج3).

وە لێرە خاڵێکی گرنگ هەیە کە پێویستە خوێنەر کاتێك ورد دەبێتەوە لە وتەکانی پێشووی دکتۆر ئەیمەن، کە ئەقباتەکان تەنها گاورنین وبەس کە لەناو موسڵمانان دەژین، بەڵکو ئەوانە کۆمەڵێکی جەنگکەرن دژی ئیسلام، تانەیاندا لە قورئان وپێغەمبەردا ﷺ، وە موسڵمانانیان کوشت وە ئافرەتە موسڵمانەکانیان بەدیلگرت: وەك (میلیا شەحاتە و وەفا قسطنطین وخوشکەکانی) الله ئازادیان بکات؛ ڕاگەیاندنی جەنگ بۆسەر ئەم کۆمەڵە خاچپەرستە فەرزی عەینە، نەوەك وتەی بێمانا لەسەر ئەهلی (ذمة) بە شێوەزارێکی بیدعەیی وداهێنراو؛ وەرن با جیاوازی بکەین لەنێوان شێوەزاری بیدعەیی وشێوەزاری سەلەفی لە وردبوونەوە لەو بابەتەی هاتوە لە سەلەف وزاناکان لەراڤەی فەرمایشتی الله تعالى: {**حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ**} [التوبة: 29]، لەگەڵ تێبینی لەسە هەندێك وێنە کە بەنزیکەیی دەیهێنین بۆ ڕونکردنەوەی مانای (الصغار) کە مەبەستمان لەوە نیە.

"لە قەتادەوە ﷺ لە {**عَنْ يَدٍ**} گوتی: **بەتوڕەیی**.

لە ئیبن عەباسەوە الله لەهەردوکیان ڕازی بێت {**وَهُمْ صَاغِرُونَ**} گوتی: **ويُلْكَزُون**. [واتا: بەشەق لێیان دەدرێت].
وە گوتی: **بەزۆرڕادەکێشرێن.**
لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ﷺ لە وتەی {**وَهُمْ صَاغِرُونَ**} گوتی: **واتا بەزەلیلی**.

لە موغیرەوە ﷺ کە نێردرا بۆلای ڕۆستەم، ڕۆستەم پێی گوت: بۆچی بانگ دەکەی؟ پێی گوت: بۆ ئیسلام بانگت دەکەم، ئەگەر موسڵمان بوویت ئەوە چی بۆ ئێمە هەیە ئەوەش بۆتۆ ئەوەش کە لەسەرمانە لەسەر تۆشە، گوتی: ئەگەر نەمکرد؟ گوتی: جزیە دەدەی بەزەلیلی، بە وەرگێڕەکەی گوت: پێی بڵێ دەزانین جزیە چیە، ئەی مەبەستت چیە لە زەلیلی؟ گوتی: **تۆ دەیدەت بەوەستاوی ومنیش دانیشتوو، وە شمشێر لەسەر سەرتە.**

وە لەسەلمانەوە ﷺ بە وانەی گوت کە لەناو قەڵاکەبوون: ئیسلام یان جزیە بەزەلیلی! گوتیان: جزیە چیە؟ گوتی: درهەمتان لێوەردەگرین، وخۆڵ دەکەینە سەرتان." [الدر المنثور - باختصار].

تەبەری ﷺ دەڵێت:

"هەرچی فەرمایشتی: {وَهُمْ صَاغِرُونَ}، مانای ئەوەیە: **ئەوان زەلیلن؛** دەگوترێت زەلیلی گەمژە: **بچوك**". [تفسير الطبري].

بەغەوی ﷺ دەڵێت:

عیکریمە دەڵێت: **جزیە دەدەن بەوەستاوی، وەرگریش دادەنیشێت؛** وە لە ئیبن عەباسەوە گوتی: **لێی وەردەگیرێت وقوڕگی دەگیرێت؛** وە کەلبی گوتی: **ئەگەر جزیەی دا لە ڕومەتی دەدرێت؛** وەگوتراوە: ڕیشی دەگریت ولە هەردوو سەر ڕومەتەکانی دەدەی؛ وەگوتراوە: گەردەنی دەگیرێت وڕادەکێشرێت بەتوندی بۆ شوێنی جزیە دان". [تفسير البغوي].

ئیبن وکەثیر ﷺ دەڵێت:

{عَنْ يَدٍ} واتا: **بەزۆری وتوندی،** {وَهُمْ صَاغِرُونَ} واتا: **بەزەلیلی وگەمژەیی وسوکایەتی پێکردن؛** لەبەر ئەوە جائیز نیە ڕێز بگیرێت لە ئەهلی ذیمە وە نەبەرز بکرێنەوە بەسەر موسڵمانان، بەڵکو ئەوان زەلیلن وبچوکی خراپەکارن، هەروەك لە فەرمودە هاتووە لە صەحیحی موسلیم، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: **"ئێوە سەلام مەکەن لە جوولەکە وگاور، وە ئەگەر پێیان گەیشتن ناچاریان بکەن بەڕێگایەکی تەنگەبەردابڕۆن".**

هەر لەبەر ئەوەیە پێشەوای باوەڕداران عومەری کوڕی خەتاب ﷺ ئەم چەند مەرجەی داناوە، کە ناسراوە بەزەلیلی وبچوکی وبەگەمژە دانانیان". [تفسير ابن كثير].

عومەر ﷺ گوتی: **"ڕێزیان مەگرن کاتێك الله سوکی کردن، وە نزیکیان مەکەنەوە لەکاتێك الله دوری خستنەوە وە ئەمانیان پێمەدەن لەکاتێك کە خیانەتیان کرد لە الله".** [السنن الكبرى للبيهقي].

**بەکورتی:** شێوەزاری زەواهیری جیاوازە بەتەواوی لەشێوەزاری سەلەف، لەبەر ئەوەی بنچینەی جێگیر لایان ئەوەیە کە ئەهلی ذیمە جزیە دەدەن بەزەلیلی وگەمژەیی وسوکایەتی پێکردن، جا جیاوازی بکە لەنێوان دەستەواژەی "هاوبەشمانن لە نشتیمان" و "لەگەڵیان دەژین بەئاشتی وسەقامگیری" تا بزانین کێیە "کە لەم دواییە هاتووە بە شۆڕش" کە تەفسیق وتەبدیع دەکات بەڵکو جەنگی دەوڵەتی خیلافەت "سەلەفی جیهادی" دەکات.